ئەمین گەردیگلانی ساڵی ١٣٤٩ هەتاوی لە ئاوایی‌گەردیگلان لە دایک بووە، یەکەم بەرهەمی «تاپۆی وەرزێکی‌سەوز» ساڵی ١٣٧٦ هەتاوی بڵاو کردۆتەوە، ئێستاش‌دانیشتووی شاری بۆکانە.

# زامی چیا

دەنگی کسپەی زامی قووڵی کێوی بێ هەتوانە وا،
دەمهەژێنێت و قەڵەم رادەچڵەکێ بەو ژانە وا!

لێرە وەک جەرگی زڵەیخا لەت لەتن جەرگی چیا
بۆیە دۆڵی پڕ چەمەی خوێن و زنەی گریانە وا!

گەرپشووی بۆ بسکی نەرمی ئاو بکاتە شانە ـ با
خەونی کانی کوانێ هەر زەلکاوی بێ جووڵانە وا!

لێرە قەت دەریا مەمک نانێتە دەم کۆرپەی هەور،
ئاسمان بۆیە نەزۆک و وشک و بێ بارانە وا!

خۆری ئاشق بۆ لە ماشقەی عەرزی چاو داناگرێ؟
شەو کەسیرەی کردووە و ناخی سەهۆڵبەندانە وا!

لێرە پێدەشت و بنار شاخی بەرز پاشقول دەدەن
بۆیە کاری لووتکە کوێنی تەم بە سەر دادانە وا!

دەمدەمانی خۆر و مانگە رۆژ و شەو دوندی چیا
بۆیە کێشرا سەر گلێنەی شیوی سەرشۆڕ تانە وا!

بۆ گوڵی بەفر و چرۆی باران و بسکی خۆر نەبێ،
شاخی گەردنکەش سەری بۆ کامە بارەش دانەوا؟!

گورزی بزمار رێزی نێو دەستی شەون ئەستێرەکان،
بۆیە لە خوێنا لەشی سەوزی چیا شەڵتانە وا!
# # #

# زەلکاوی زەمان

با دڵی شەو لە تکەی ئەشکی بەیان هەڵکێشین
خۆ لە کانیاوی بزەی سەوزی ژیان هەڵکێشین
با لە سەر کێش و هەوای زەردەخەنەی بووکی غەزەل
هەست و ئەندێشە لە رووباری زمان هەڵکێشین
وەرە! با کاتێ چرۆی چاوی بەیانی پشکووت
دڵ لە ئاونگی بەرۆی خونچە گوڵان هەڵکێشین

با لە سەر رووومەت و برژانگی تەڕی ئەستێرە
رۆحی سڕمان لە هەناوی پەرییان هەڵکێشین
با بەدەم سروەوە بشنێتەوە سەروی سەرمان
تاکوو کەنگێی لە قوڕی قین و گومان هەڵکێشین؟
شاری داپۆشی تەمی زەردی هەناسەی تاعوون
بۆ تەوێلیشی لە قیلی شەوەژان هەڵکێشین
ماڵ و کۆڵان گڕی مردن لە دەماری دەگەڕێ
بۆچی ئەم ژینە لە تاڵاوی نەمان هەڵکێشین؟
شۆستە جەستەی هەموو خووساوە بەخوێناوی گەڵا
بۆ شەقامیشی لە دوودەی خەمی نان هەڵکێشین؟!
گوو گلێنەین، دەگلێنین شەو و رۆژ تۆپی ژیان
تاکوو ئەم خاکە لە زەلکاوی زەمان هەڵکێشین

گیان کەنشتی شەو ئەبینین ئەگە تێکرا دڵمان،
لە شەتاوی قژی زێڕینی بەیان هەڵکێشین.

# # #

# رەشاو

کە باخ تەورداس و چەقۆی لە داری خۆی دەکێشا،
خەزان چرۆ و پەلکی بەرەو هەواری خۆی دەکێشا
زەمانە باهۆزی گرەی لە بەژنی خۆی دەپێچا
سروشت چزووی پایزی بۆ بەهاری خۆی دەکێشا
شەپۆلی چۆم، زیندەوەری بە لۆدە رادەماڵی
هەمووی بەرەو قورگی دڕی کەناری خۆی دەکێشا

هەسێل کەڵاورێژ بوو لە قەوزە کاتێ دیتی کانی،
بە جۆگە ژاراوی بەرەو دەماری خۆی دەکێشا!
هەتاو رم و شیری گڕی لە چاوی دادەباراند،
دەمێ چیا باڵی وەسەر بناری خۆی دەکێشا

تەژی لە دووپشکی رەشی گومان بوو مێشکی فەرهەنگ
زمان خەتی ئاوری لە دەوری زاری خۆی دەکێشا!
کە ماری حەو زاری فەساد لە بەژنی ژین دەهاڵا
ژیان، حەساری سیری بۆ ژیاری خۆی دەکێشا!

ئەوین کە دیی باخی بەهەشت لپا و لپی دەهۆیە
بە کۆڵ گڕ و سکڵی بەرەو مەزاری خۆی دەکێشا!
وەری قژی کەسک و تەڕی سنەوبەر و سپیدار،
دییان شەقامی رەش رقی لە شاری خۆی دەکێشا

رەشاوی خەم، رۆح و دڵ و ژینی تەنیم بە جارێ
کە دیم زەوی، قورمی بەرەو دەواری خۆی دەکێشا!
# # #

# شەوە ژان

لەم خاکە چرۆی ئەشک و گوڵی زام کە نەپشکوێن،
گڕ تیخی زمانیان لە لەشی لەتلەتی دەسوێن

غەیری کوڵی گریان و رنینی قژ و رووومەت
چییتر لە خەم و ژان و کوڵی ئەم دڵەم ئەدوێن؟

با ـ لێرە پەڕی کۆتری زۆر داوە رەپێچەک
ناویانە لە هەش شۆڕەبی پرچ و ملی بە کوێن

ئەستێرە گەلێ کەوتنە نێو قوڕگی ڕەشی شەو
بۆ مەرگی هەتاویش چووە مانگ بێ سەر و بێ شوێن

گڕ بسکی تەڕی سوورەگوڵێ زۆری پرووزاند
هەر ڕۆژی بە داسێ مل و پەنجەی گوڵ ئەدروێن

شاخ و شەوەزەنگ پێکەوە زۆر دەستەملان بوون
زۆر جار پەلەشی داوە لە داوێنی چیا، خوێن!

دوای ئەم هەموو تاڵی و کەسەر و ڕۆژە ڕەشانە،
دوای ئەم شەوەژانەی دڵ و جەستە و وزە تاوێن،
بێژی لە هەناوی شەوی سامناکی ژیانا
خۆرێک و هەزاران گەشە ئەستێرە نەگوورێن؟!

# # #

# هاواری گەڵا

دڵۆپێ خوێنم، لە زامی وشەی ئەوین تکاوم
لە سەر بەرۆکی زەردی شیعرێکی خەمین گیرساوم

هاواری کپی وەرزی ژاکاوی لێک دابڕانم
لە گەرووی ویشک و زەرد و تاساوی گەڵا هەستاوم

لە ژێر تەوژمی رەشەبا و تەرزە و شەستە بارانا
گەڵایەکم کە لە ساواییەوە لە دار دراوم!

رووباری شیعرم، بۆ باوەشی ژین کە ڕێگە دەبڕم
بەردی هەر خەمێ بێتە ڕێم، سەری تێهەڵدەساوم

هەتاکوو پشتم بە قامچی ئازار زیاتر بکێڵن،
تا بیڕەتێنن هەلووکی دەست و لاقی پەڕاوم؛
لە نێو دڵما هەر ڕەگاژۆ دەکا، نەمامی هیوا
ئەمسا لە سایەی دەگەم بە ژین و ئەوین و کاوم

###

# رۆحی زریکە

شاعیر کە بە بیر و چەمی رووناکەوە هەستا،
پێنووس بە دڵێکی گەش و بێباکەوە هەستا

لێوی گەشی هەڵساوی لە کوڵمەی تەڕی شەونم
خونچە کە بەیانی بە دڵی چاکەوە هەستا

خۆر هەنیە لە سەر شانی چیا دادەنێ هەر شەو
بۆیە بە نیگای گەرم و دڵی پاکەوە هەستا

دەسنوێژی بە کانیاوی گزنگ گرت زەوی، بۆیە
هاوار لە هەناوی شەوی سامناکەوە هەستا

لانەی لە دڵ و مێشکی زنار و ڕەوەزا کرد
ئەو ڕۆحی زریکەی لە دڵی خاکەوە هەستا

ئەو بەرزە چنارەی کە دەمی نایە دەمی خۆر
خەڵفێ بوو، لە پێچ و قەفی باداکەوە هەستا

شایی دەگرن واژە لە پێدەشتی غەزەلدا
شاعیر کە بە بیر و چەمی ڕووناکەوە هەستا.

# # #

# بزەی خوێناوی

هەڵپڕووکانی گوڵی تاسەم لە بەر بێ تاویيە
شیوەنی شیعرم لە دەس ژینی خەم و دەرداویيە

هەڵبزرکانی بزەی زێڕینی ئاسۆم دێتە بیر
بۆیە چاوی هەوری شیعرم دایمە فرمێسکاویيە

داوی داپیرۆشکە باڵی پەڕپەڕۆکی سەوزی چاو
بۆیە هەنیەی باخی ئاواتم تەپ و تۆزاویيە

هێند لە چاوی شەو چەقی برژانگی ئەستێرەی وشەم
لێوی زێوینی بەیان کەیلی بزەی خوێناوییە

روومەتی رووشا بە چڕنووکی شەوی دڕ سوورەگوڵ
بۆیە بەرگی زیی لە بەردایە و لەشی دڕکاوییە

شەو لە نێو پیاڵەی گوڵا خوینی دڵی یەکتر دەخۆین
رۆژگار بۆیە لە گەڵمانا فڕوفێڵاوییە
پەنجەمان تاکوو چەمۆڵەی شەو لە چاوی رۆژ بنێ
دڵ، بەشی هەر ماتەم و ئازار و لێ قەوماوییە

مانگی چاردە جار و بارێ دێت و خەرمانەی دەدا
چاوەڕێی بارانی لێ ناکەم پەڵەی بێ ئاوییە
شەو بە نەختالێ تریفە رووی سپی نابێتەوە
میچی ئاسمان چون بە دوودەی جەرگی خۆر قورماوییە

###

# ڕێبوار

بۆ هاوڕێم: محەممەد ئەمین شاسەنەم

نایەڵێ ژانی ژیان، تاوێ لە دنیا وەحەسێم
چاوەڕێی سێبەری مەرگم کە لە بنیا وەحەسێم

من لە دووی ژوانی مەرگ وا شەکەت و ئاوارەم
دێم لە نێو باوەشی ئارام و ئەمنیا وەحەسێم

دڵ هەموو پڕ لە ڕقن، بۆیە لە ژین بێزارم
دێم و باکم نیە، بەڵکوو تەک و تەنیا وەحەسێم
دوورە ئاسۆگی ئەوین و شەبەقم لێ بزرە
هەر دەڕۆم، تا لە هەواری دڵی ونیا وەحەسێم

ڕێگە رژد و هەڵەتە، لێمی برِی هێز و برِست
ماومەوە، ڕێ ببڕم، بێمەوە من، یا وەحەسێم؟!

چاوەبڕکێنە لە گەڵ ڕۆحم ئەکا شۆخی مەرگ
تاوەکوو بچم و لە زەنوێری بەژنیا وەحەسێم
شەرتە قەت دەس لە بەرۆی گەرم و گوڕی هەڵنەگرم
با لە پاوانی دڵی سەوز و مەزنیا وەحەسێم

# # #

# هەتاوەکەم

کە تیشکی رووت هەتاوەکەم لە ژینی من نەدیوە!
خەیاڵ و بیر و هەست و پەنجەم و دڵم تەزیوە!

کە بێی شەپۆلی تیشکی ماچ لە کوڵمی کێو بساوی
دەنەخشێ بەژنی بەرزی کەژ، بە زەمبەر و زریوە!

شەلاڵی بۆنی شەو بوون ئەوی وشەی غەزەلمە
وەتی لە بیرمە چونکە رۆژی رۆشنم نەدیوە

ڕەشاوی ناخی شەو ڕژا بە سەر نیگای بەیانا
کەوا تەوژمی مژ لەشی سڕی زەویی تەنیوە؟!

لە نێو هەناوی دووکەڵا پشوو دەدا، بڵێسە
کە دێتە دەر، ڕمی چەمی لە جەرگی شەو چەقیوە

هەتاوەکەم! وەتی نیگات لە گۆڕی نووتەکایە
شەوانە خەونی رووگەشم بە چاوی تۆوە دیوە!

هەتاکوو ئەو دەمەی کە نزگەرەی مەرگ دەدا شەو
هەمیشە چاوی چاوەڕێم لە ڕێی بەیان بڕیوە

پڕیشکە شەونمێ کە شەو لە رووی خەیاڵم ئەپژێ،
لە لێوی گوڵوشەی گەش و تەڕی ئەوین وەریوە

# # #

# چەواشە

له بن تەم و غوبارێکی چڕ و پڕدا بزر بوون
ئەوەی ئەوین و جوانی‌یە، ئەوەی حەز و حەقیقەتە
تەم و مژە، مرۆڤ و ژین، سروشت و بوون، دژی یەکن
درێژەدان بە ڕێی ژیان مەحاڵە هێندە سەختەتە
ئەستێرە، لە نێو ئەستێری قیلی شەودا نوقم بوون
کازیوە، پەچەی ڕەشی شەو لە سەر ڕوخساری لانادا
دار، لێو و پەنجەی تەرچکی گەڵا و چرۆی دەقرتێنێ

سروە، گڕ لە خۆی بەردەدا، لە دۆزەخی گڕەبادا

لێو، سەری بزەی خۆی دەبڕێ؛ چاو، سۆمایی دەخنکێنێ
هەناسە، لە نێو گێژەنی دووکەڵدا خۆی حەشار ئەدا
گەڵا، شنەشن خۆ دەکوتێ بۆ باوەشی زەردی زریان،
بە گوریسی گەردەلوولی پاییزی خۆی لە دار ئەدا

بڵێسە، ئاشقی ئاوە و بەرگی شەپۆل لە بەر دەکا
لە پێخەفی قەوزە و کەفا پێلووی دەریا قورسی خەوە
دڵدار، لە جێژوانا دڕوو لە بسکی دڵبەری دەدا
چاوی پەپوولە، تامەزرۆی دیداری تاریکەشەوە

وشەی ئەوین، لە هەواری سەوزی گۆرانی وەرمەزە
جینگڵ دەدا و وەکوو ئاسکی سلۆک خۆی رادەپسکێنێ
هەر مەلە و دەگەڕێ بە شوێن داو و تەلبەند و رکەدا،
ئەویندار دەلە بوونە و هێلانەکەی دەرووخێنێ

برینەکان، پۆلپۆل بەرەو پیری ئامێزی خوێ دەچن
قەتماغە، بۆ تیژ کردنەوەی کێرد و چەقۆ بوونە زبرە
تەم، لە ژێر پەچەی قەوزەدا خۆی لە هەور شاردۆتەوە
چیای تینووش، گرتوویەتی داوێنی ئەم هەورە قسرە

دێژەدان بە ڕێی ژیان مەحاڵە، هێندە سەخڵەتە
تەم و مژە، تەم و مژە، تەم و مژە، تەم و مژە
رۆح و ئەندێشە، لە جەغزی سەر لێشێواویدا ونن
گەرچی لە سەر تەوێڵی شەو، نەرواوە کاروانکوژە.

# # #

# گوڵوەشان

بۆ ڕەهێڵەی چاوی شیعرم زامی تۆ چەخماخەیە!
خوێنی تۆ تەنیا تروسکەی نێو دڵی ئەم چاخەیە!

غەیری تەرمی هەڵپڕووکاوی گوڵووکی ئارەزووت
چی هەیە و خۆراکی قوڕگی شیوەڵی ئەم باخەیە؟!

لەرزەلەرزی کۆڵەکەی ئەم کۆخە ڵارووخاوەتە
ڕاگری بنمیچی چیمەنتۆی ڕەشی ئەو کاخەیە!

سفرەکەت بۆنی هەناسەی جارەگەنمی لێوە دێ
کوڵمی ئاگر سووتی نان، سورمەی نیگای ئەو شاخەیە!

دڵ بە بۆنی ئاوپژێنی پرچی خاوی زێدەکەت
مەستی مەستە و رۆحی سەرچاوەی زنەی ئەم ناخەیە!

دەس دە داسی سەوزە لێوی زەردە تێزاوی هومێد
بێرە سەرچاوم لە فرمێسکم بدووره باخەیە،

بیبە بەژنی پڕ لە زامی دەشتی پێبکە گوڵوەشان
لێرە هەر فرمێسکە هەتوانی دڵی ئەم ئاخەیە!

###

# شنەی پشکوتن

کە هەور دەگری، ئەتۆ دەستی بە باڵا دێنی!
شیرنە مۆچڕکی فڕینی بە خەیاڵا دێنی!

تۆ وەکوو ڕێژنە بزەی گەرمی بەیانی نەورۆز
دەس بە سەر یاڵ و بژی نەرمی شەماڵا دێنی!
تۆ هەناسەی پەمەیی نەرمە شنەی پشکووتن
بە مل و سنگی سڕ و زەردەڵیساڵا دێنی!

له دەماری دەگەڕێ خوێنی کەسک، وردە چرۆ
کەشنەی وادە بە باخ و چەم و یالا دێنی!
تۆ وەکوو هەورەتریشقەی بە گوڕ و تینی بەهار
رەوەز و جەنگەڵ و کوێستان وەسکالا دێنی!
نیونیگای تیژی برووسکەی لە دەلاقەی هەورا
خەنجەری گڕ بە دەماری شەوی زالا دێنی!
وەکوو فرمێسکی چەمی هەوری، بە بێ جیاوازی
سەر بە سەر شانی گولالە و دڕوودالا دێنی!
ئەو ترووسکەی، کە لە جێژوانی ئەوینا پشکووت
تیشکی هیوا بە دڵی تار و بەتالا دێنی!
تۆ بە ئاسۆگی خەمی زەردەپەڕا تێدەپەڕی
لێو بە سەر زامی چیای جەستە شەلالا دێنی!
بۆ ئەوین و گوڵی شۆڕان سەری خۆت دانانێی
لە حەوا دەم بە مەم و کوڵمی خەزالا دێنی!
تۆ شنەی سەوزی، قژی زەردی گەنم دادێنی
شەو بە ئالاوە شنەی شاپەڕی ئالا دێنی!

# # #

# ئاماژە

خۆری شێعرت کە لە ئاسۆگی روحت هەڵدێ ئەویندارانە!
بۆ ژیان زەمبەر و فرمێسکی دەکاتن بە گوڵ و گەردانە!

دەنگی ناڵەت لە گەرووی هەوری رەشی دڵپڕەوە دابرژێ
لە دڵی گشت رەوەزێکا وەکوو یەک سازی دەکا هێلانە!

تۆ کە باڵا و بزەکەت خۆر و چیا پێکەوە شەرمەندە دەکا
بۆ بە خۆتا هەڵەواسی زەمەر و خشڵ و گوڵ و لەرزانە

گوارەکەت ئەڵقە بە گۆی بوونەکەلەپچەی مەچەکت بازنەیە
تۆ و زەنجیر لە ملت دا وەکوو ملوانکەیە، کۆت پاوانە

ئە تۆ شاباڵی هەناسەت کە نەدایە بە هەور، چۆن دەگەیی؟
زێڕوەشان کا لەش و لاری زەوی بەو دەنکە ترێی ئەشکانە!
پەڕ پەڕۆکێ کە لە گوڵجاڕی خەیاڵی گەشی تۆ هەڵنە فڕێ،
گوڵپەڕی ڕۆحی ئەوین و بزە بۆی دەبنە شنەو جۆلانە؟!

تیشکی چاوت کە لە بن هەوری ڕەشی مەقنەوە دابڕژێنی
کۆلکەزێرینە، گوڵم! پردی ئەوینی مە لە پاش گریانە!

زستانی ٧٩
###

# برووسکەی فرمێسک

ڕۆحی شەِ کردم بە چەخماخەی تەڕی فرمێسکەکەی
شیعری عیشقی پێوە بوو، کوڵمەی پەڕی فرمێسکەکەی

تاڵە تیرێژێ لە ئاسۆی چاوەکانی دەرکەوت
وەک خڕۆکەی سوور بە ڕەگما تێپەڕی فرمێسکەکەی

تا هەتا شیعرم کراسی گڕ لە بەر داناکەنن
چون لە سەر ئاسمانی هەستم هەڵپەڕی فرمێسکەکەی

شۆخە دۆی لێو پڕ بزەی ئەم داوەتی خولیایەمە و
بەزمی دیلانی خەیالم، شەوگەڕی فرمێسکەکەی

کۆلکەزێڕینەی هەزار جوانی بوو تا زەریا بوو جێی
تا گەیشتە روومەتی رەنگی پەڕی فرمێسکەکەی
هێندە پەلکی تورتی گۆنای مشتووە سروەی نیگام
سڵ دەکا پێلووی لە هاژەی شاپەڕی فرمێسکەکەی

هەلقولاوی قولپی کانیلەی زولالی ئیشقە، یا
شەونمی چاوی شنەی بێ باوەڕی فرمێسکەکەی؟

رەنگە ئەنگاوتەی پشووی زریانی ئیشقم بێ، کەوا
کەوتە دەس با گەڕ گولووکی پەڕپەڕی فرمێسکەکەی؟

توولەرێی رژدی نیگای بردی بەرەو هەلدێر دلم
تاکوو کەی بڕچێ بە شەختە و سەرسەڕی فرمێسکەکەی؟
بوومە باویلکەی قەتیس ماوی کەناری رێی نیگای
کەی دەبێ راپێچەکم دا باگەڕی فرمێسکەکەی؟!

# رازەوان

له تاوت سینەکەم بەندی گەڕۆکە و دیله دڵ تێیدا
خەمت جۆڵاتەنێیه، پەڕپەڕۆکە و دیله دڵ تێیدا

وەکوو ژوورێکی پڕ سام و کپ و قورماوییه سنگم
کڵاوڕۆژنەی نیه، تار و تنۆکە و دیله دڵ تێیدا

وەتی گرشەی هەسارەی گوڵبزەی ئیشقم له روو دیوی
نیگات دوو ڵاپەڕەی پڕ ناوەرۆکە و دیله دڵ تێیدا

بە دایم رازەوانی دوو ترۆپکی بەرز و بەفرینم
کە دوو دوندی چیای بەرزی بەرۆکە و دیله دڵ تێیدا

له گێژاوی ئەویندا دەبێ حاڵی چ بێ؟ کاتێ
ترووسکەی روونی ئەشکت دوو تنۆکە و دیله دڵ تێیدا

# # #

# گوڕوو شکێن

شەو بە سەردا هاتەوە و دیسان گوڕوو دەگرێ دڵم
کەی بە فرمێسک و خەم و تەنیایی خوو دەگرێ دڵم؟
هێندە سینەم پڕ لە سۆز و هەستی فرمێسکاوی‌یە
هەڵدەسێ ئەوشۆکە سێڵاوی گڕ و دەگرێ دڵم!

هێندە شاباڵی لە تیرێژی نیگام ساویوە شەو
چەشنی پارچک دێ وچان ڵای کوندەبوو دەگرێ دڵم

داخی ناخم گەر بە لێمشتی غەزەل توونا نەکەم
تۆزی ئازار و خەم و ماتەم هەموو دەگرێ دڵم

تاسەباری هەڵمژینی کوڵمی سەوزی ئیشقە، وا
جار و بارێ دێ بەرۆکی ئارەزوو دەگرێ دڵم

گەر هەناسەم دەست بکاتە مل شەپۆلی بسکەکەت
لەنگەری شەوگاری جێژوان هەر بە موو دەگرێ دڵم!
بێتوو بارانی ئەوینی تۆ بە سەر ئەندێشەما،
دانەبارێ؛ خەم وەکوو غەور و کەڕوو دەگرێ دڵم!

# # #

# ئۆخژن

چڵێ تیشکم، لە زنجی خۆرنشینا ئۆقرە دەگرم
مەمی ئیشقم، لە بێشکەی سینگی زینا ئۆقرە دەگرم

ئەمن دڵداری رووناکی و بزە و جوانیم، گوڵم! چۆن
لە شەوگاری بە سامی داخ و قینا ئۆقرە دەگرم؟

بە ئاوی کانیاوی خۆرەتاو گرتوومە فرچک
لە جۆلانەی شەپۆلی پێکەنینا ئۆقرە دەگرم

کەمن چرتەی ترازانی بەرۆی خونچەش دەبیسم
لە نێو قرچەی دڵ و کسپەی برینا ئۆقرە دەگرم؟!

چپە و سرتەی گەڵا و سروە، دەبزوێنێ خەیاڵم
ئەمن تەنیا لە نێو باخی ئەوینا ئۆقرە دەگرم

لەرەی برژۆڵی ئەستێرە نەکا بۆم لایە لایە
بە شەودا چۆن لە شیوەنگای گرینا ئۆقرە دەگرم

وتم: رۆژێ بە رۆحم لا لە ئیشق لادە ئیتر
بەرەو بەرزی فڕی خێرا، وتی: نا، ئۆقرە دەگرم

دڵم رێبواری رێگەی کاکەشانی ئیشقی تۆیە
هەسارەی راخوشیوم، چۆن لە ژینا ئۆقرە دەگرم؟!

###

# تەنیایی

بۆ ژیان غەیری کەسەرباری نەبوو، تەنیایی
تا بووە هەر خەمی پێداوە بە شوو، تەنیایی

باوەشی گرتەوە بۆ هاتنی شەو بووکی زەوی
کەچی رۆیکرد لە دڵ و جەرگی چزوو، تەنیایی

زەردەپەڕ هەر کە پەڕەی کوڵمی لە کوڵمەی شەودا
لەشی پڕ کرد لە موچڕک و لە تەزوو، تەنیایی

پڕە ئامێزی بە دایم لە هەنیسک و گریان
ڵانەیە بۆ خەم و فرمێسک و گوڕوو، تەنیایی

بە هەنیسکانەوە بۆچی دڵم هەڵناکەنری؟
کە گەرووم ڕێک دەگوشێ بوغز و خەم و تەنیایی

دەگەڕێ موو بە موو هەر شەو بە دەماری لەشما
بۆ دڵی پڕ لە کوڵم بۆتە زەروو، تەنیایی

# # #

# ئەوین

پێنووس و خەیاڵ کاتێ لە رازی خەمم ئەدوێن
پۆلپۆل بە تەوێڵی پەڕەوە گوڵوشە دەڕوێن
خەرمانە دەدەن واژە لە دەوری دڵ و هەستم
بۆیە مەمی هەوری حەز و ئیلهامم ئەبزوێن

ئەو شۆخە لە ئاسۆوە کە سەر هەڵدەبڕێ و دێ
کێوان سەری کڕنۆش لە گڵی بەردەمی دەسوێن

ئۆخژن و تەزووی تاسە و حەز دادەگرێ دڵ
کاتێ کە گوڵی زەردە لە سەر لێوی دەپشکوێن

چاوی کە بە سەد نازەوە دەخشێنێ لە چاوم
ئەندامی لەشم پاکی بە مۆچڕکە دەبزوێن

دەرژێ لە چەمی تیشک و، دەسی پڕ لە گزنگە
گوڵ بۆیە هەموو خۆ لە دڵ و باوەشی داوێن

بریا دڵەکەی بۆ دڵی من بوایەتە بێشکە
ئەوکاتە خەمم پاکی دەبوون بێ سەر و بێ شوێن

# # #

# شەونخوونی

کێشاویەتی گەلێ شەو، پێم شەونخوونی ئەسرین
داومە قوڵنگی ئاهم، لە بێستوونی ئەسرین

زۆر رۆدەچم بە ناخی رۆحی پەرۆشی خۆما
ناگەم کەچی لە رازی ژانی دەروونی ئەسرین

هەر شەو دڵم لە بێشکەی تنۆکێکایە، دەنوێ
لە گەڵ هەنیسک و ژان و گرِی سەبوونی ئەسرین

کاتێ بەخەم دەڕاکێ، گوڵی بزەم لە سەر لێو
دەدێرێ جارێ گۆنام، بارانی روونی ئەسرین

لەو کاتەوە پەریی حەز، بۆتە هەیاڵی رۆحم
ژیانی هەڵکزاندووم شەپۆلی توونی ئەسرین

سۆمایی چاوەکانت، بە جارێ هەڵمژیوم
دە ساتێ ئۆقرە بگرە، خۆ تۆ زەروو ـ نی ئەسرین!!

# # #

# گڕەی هەناسە

خەم لە گوڵجاڕی دڵمدا دڕک و داڵی چاندووە
بسکی کەسکی چیمەنی هیوامی ئاڵۆزکاندووە

زیزە خونچەی ئاڵی فرمێسکم لە پێدەشتی ئەوین
چون گڕەی گەرمی هەناسەم رەنگ و رووی ژاکاندووە

تۆزو غەوری ناهومێدیم نیشتە سەر جامی خەیاڵ
چون لە حاستم هەوری هیوا چاوی خۆی قووچاندووە

تازە نارێژێ تنۆکێ ئەشکی بۆ بەدبەختیی من
ئاوری دڵ چونکە زەریای رۆندکی سووتاندووە!

روو لە ماڵۆچکەی دڵم ناکەن پەریی خەونی سەوز
چونکە مۆتەی دڵڕەشی ماتەم هەمووی رووخاندووە

ئەشکی پێنووسم وەکوو خوێنی دەمارم وشکەڵات
داخ و مەینەت سۆزو هەست و بیرمی شێواندووە

تازە کەی دەڕوێ بە فرمێسکم گوڵاڵەی شیعری تەڕ!
خەم لە دڵما چەشنی خۆرە ریشەکەی قرتاندووە

# # #

# ئاونگ

تا بەیان ڕۆحی شەوی تاری لە نێو سنگا دەژی
چاوی ڕوونی خۆر لە نێو ئەسرینی ئاونگا دەژی

هەنگی هەستم تاکوو گوڵجاڕی ئەوین جێژوانی بێ
لێوی شیعرم هەر لە گەڵ شیلەی گوڵ و ڕنگا دەژی

پڕ لە زەڕڕەی ئەشقە ناخی کۆڵەکەی تیشکی نیگام
تا دڵ و بیرم لە ڕۆچنەی سەوزی پڕشنگا دەژی

قەت ئەوین و خۆشەویستی ناخی دڵ جێ نایەڵن
ئاگری کوانووی لە گەڵ سووتانی ئێزنگا دەژی

کانی ئەشکی روونی چاوی قەت وشک نابێ، کەچی
رۆژ و شەو ئەستێر تەمی قەوزەی لە نێو چنگا دەژی

خشڵی بسکی لوولی سروە: پەلکی ژاکاوی گوڵە
گەرچی خونچەی گوڵ لە نێو پەرژینی هارژنگا دەژی

سەد دەور تەیمان و شوورە بینە لەمپەر بۆ ژیان
رۆحی تینووم هەر لە باوەش خۆر و ئاونگا دەژی

###

# دەردی پاییز

کاکۆڵی هەڵپڕووزا، گوڵجاڕ و هەردی پاییز
خوێنی چرۆ دەچۆڕێ، لە چنگی زەردی پاییز

داپۆشی زوقم و سیخوار، برژانگ و روومەتی خۆر
پەنجەی لە گۆ چوو پڕشنگ، بە تۆفی سەردی پاییز

شەختە لەشی درەختی پڕ کرد لە زام و پەترۆ
هەرچی گوڵ و گەڵا بوو، بردی بە دەردی پاییز

خاکی کەسیرە تاکەی، لێوی تواتوا بێ؟
تاکەی دڵی بچرژێ، شەونم بە بەردی پایز؟

واژەی سەوز نەماوە، لە دەفتەری بەیانا
ئەمشەو هەمووی پرووکاند، چەپۆکی زەردی پایز

هێندە وەریوە پەنجە و لێوی گوڵاڵە، تەنیا
خەزانەکەی هەڵەبجە، دەگا لە دەردی پایز

# # #

# ژیانەوە

خۆزگا لە باخی لێوتا واژەی ئەوین دەرسکا!
پڕ بە شەوی نیازت، پرشنگی ژین دەرسکا،

بۆ وردە پێلی تاسەم، عیشقت دەبوو بە رێباز
لە سەر نیگای زوڵالی، سەد پێکەنین دەرسکا؛

شانەی دەکرد هەناسەم، چینی شەپۆلی کەزیەت
ئەودەم لە کانی دەمتا، ماچی بەتین دەرسکا!!

پێسیری ئاوەڵای گوڵ، ژوانگەی دڵی پەپوولەن
ئەوین نەبا گوڵاڵە، بۆ هەڵوەرین دەڕسکا.

دڕکی کەسەر نەهاڵێ ریشەی لە رۆحی باخان،
گوڵباخی زەردە خەندە کوا بێ برین دەڕسکا؟

عەرزی سەری لە دەوری چاوی هەتاو نەگێڕێ،
کەی باخی پڕ هەسارەی ئاسمانی شین دەڕسکا؟!

ودمی ژیان لە بۆنی قژیا نەبا گەنم، کوا
بەژنی زراو و شلکی بۆ سەر بڕین دەڕسکا؟!

کۆڵانی چۆڵی شەو کوێر بەیانی تێنەزایە
شەو، هەر گوڵی سەهۆڵی لەسەر سەرین دەڕسکا!

# # #زستانی ٧٩

# مەرگی ئەوین

ئەمشەو شەوی مەرگی ئەشقە، لە جیهانی دڵداریما
کوڵمەکانی تۆ تابووتن بۆ ماچە کوژراوەکانم
شیعر سنگی بووە بە گۆڕ، بۆ بزە و خۆزگە و گۆرانی
چاوی ڕەشی قەڵەم دەگری، بۆ نامە سووتاوەکانم

ئەمشەو ئەستێرەکان هەموو، چزوو لە چاویان دەبارێ
سینگی زوڵاڵی پەنجەرەی ژوورم ئاژن ئاژن دەکەن

پەریی شیعر لە ئاسۆوە، خەمناک و چاو فرمێسکاوی
بە بەژنی ئاگرینەوە، چاوبرکێ لە گەڵ من دەکەن؛
رۆحیان مەکۆی زامە، چاویان ئاگر پژێنی ماتەمە
بۆ مەرگی ئەوینی ئێمە ئۆقرەیان لێ هەڵگیراوە
ئەشقی ئێمە ئاسمانێ بوو، پرپر لە پەپوولەی سەوز
دەیانپرژاند بە روویانا، عەتری گۆرانی و هۆنراوە.

ئەمشەو گیانی رەشپۆشی شار، رەنگی تەنیایی گرتووە
بۆیە پۆلپۆل مەلی گریان بەرەو دڵم کەوتوونە رێ
وشەی ئەوین هەڵدەقرچێن، لە نێو دۆزەخی ئازارا
پێنووس و ئیلهام و خەیاڵ بۆنی زەردی خەمیان لێ دێ.

# # #

# خەرمانە

دڵی وێڵم بە نێڵەی ئاورێک سووتاوە مەستانە
بە دووکەڵ کۆڵەکەی بەر میچی ئاسمان داوە مەستانە!

بە جێی فرمێسک و خوێن، شێعرم لە نێو چاو و دەمار دایە
لە سەر تەرمی ئەوین ڕۆحم ئەوند گریاوە مەستانە!

چپەی لێک دابڕانی دابە گوێی باخا کزەی پاییز
سەری هەڵگرت گەڵا، ڕۆیی بە دەم شەوباوە مەستانە!

ختیلکەی ڕۆحی نەسرەوتووم دەدا ڕسکانی ئەو وەرزەی
لە گەڵ گەڕیانی خوێنما دێ بەرەو سەرچاوە مەستانە!

بەهارێکی لە باوەش دایە ڕۆحی هەڵپڕووزاوم
لە سەر شاباڵی سەوزی خۆر هەڵات وێستاوە مەستانە!

بەهارێکم لە ئاوێنەی دڵی ئەم خاکەدا دیوە،
کە گابەردیش لە باوەشیا چرۆی دەرداوە مەستانە!

لە ناخی چڵکە دووکەڵ دا گوڵاڵەم چاوی هەڵنایە
پشووی سروە، بەیانان بسکی داهێناوە مەستانە
ئەگەر ئەو ڕۆژە بێ ماری سپی و ڕەش یەکتری قڕ کەن
دەدا خەرمانە مانگی گوڵ نیگای ئەو چاوە مەستانە!
# # #پاییزی ٧٩

# باران

ئامێزی هەوری بەردا، دڵۆپی وێڵی باران
خۆی خستە باوەشی با ـ و کاروان و خێڵی باران

کلتووری هەوری پڕ کرد لە کل، دەستی برووسکە
چاوی بەیان دەڕێژێ، ئاسۆ بە مێڵی باران

دەیکاتە جارە شەونم، ئەم قاقڕی دەروونەم
تا، پڕ لە ئەشکی شێعرە، چاوی هەسێڵی باران

پەنجەی دەنێ بە زامی سنگی کەژ و چیاوە
زەردەی دەزێتە لێوان، سۆلاڤی لێڵی باران

رەوەز شەقار شەقارن، لە بەر تەوژمی رێژنە
کەنگێ لە بەرد ئەترسێ، شووشەی تەوێڵی باران؟

کەیلی سروودی ژینن، ناخ و گەرووی چرۆکان
نۆتی پرپیشکە دەرژێ لە لێوی هێڵی باران

شەوبا کە رادەژێنێ، بێشکەی هەور بە نەرمی
تۆ، زوو لە سەر بەرۆکی شەوبۆ رەهێڵی، باران!

رەنگە حەزت لە ماچی بسکی تەڕی گەنم بێ،
بۆیە بە نووکی برژۆڵ، عەرزی دەکێڵی، باران!

گەر ئاشقی زەوی نیت، بۆچی وەها بە سەر دێی؟
دواییش بە باڵی تیشکێ، بەجێی دەهێڵی، باران!
# # #

# بەهار

بە زەبری مشتی تیشکی خۆر شکا پشتی رنوو ئەمڕۆ
شنەی با دایڕنی کفنی سڕی داران بە فوو ئەمڕۆ

چلووره و بەستەڵەک پاکی بە جارێ تەفروتوونا بوون
عەتر دەڕژێ لە ئاسمان و نەما باوی کولوو ئەمڕۆ

گوریسی عومری زستان و سەهۆڵ و شەختە وا پچڕا،
بە دەستی سروە چون باریک ببوو چەشنی دەزوو ئەمڕۆ

بەهار رۆحی بە بەر جەستەی سڕ و بێ گیانی عەرزا کرد
گەرم داهات زەوی، فەوتا کزەی سەرما و تەزوو ئەمڕۆ

بزەی زێڕین و گەرمی خۆر دەبزوێنێ دڵی سەحرا
دەخەملێ هەرد و کەژ وێنەی بەهەشتی ئارەزوو ئەمڕۆ

چنوور و نێرگس و نەسرین، هەڵاڵە و مێخەک و شەوبۆ،
گەزیزە و سمل و سۆیلانە، گوڵاو ڕێژن لە ڕوو ئەمڕۆ

لە بەردا شڕ دەکەن بەرگی خەفەت، دار و دەوەن پاکی
بە سەریانا گوڵی سوور هەڵدەواسن موو بە موو ئەمڕۆ

بە گوڵ بەژنی بڵندی خۆی دەڕازێنێتەوە کوێستان
دەتارێنێ لە سەر نەینووکی دڵ ژەنگ و کەڕوو ئەمڕۆ

لە ئیشقی گوڵ، هەور گەوهەر دەبارێنێ لە چاوانی
لە سایەی گوڵ، دەبن پاراو درەخت و گیا و دڕوو ئەمڕۆ

لە بۆ ماچی تەوێڵی خۆر، هەموو پشکووتووە لێویان
چرۆی هەرمێ و باڵووک، سێو و بادام و هوڵوو ئەمڕۆ

دەرمخسن گوڵ، بە ئاهەنگی دڵی شمشاڵی کاکی شوان
کە دانیشتووە لە ژێر سای بسکی سەوزی دار بەڕوو ئەمڕۆ

دەکەن شادی لە نێو باخان هوزار و کۆتر و شالوور
لە سەر کێوان کەو و کورکوڕ، هەڵۆ و کوند و پەپوو ئەمڕۆ

لە حاستی کاری جوانی باری سەریان دانەواند پاکی
شلێرە و شۆڕەبی، پۆلی وەنەوشەو شۆڕەتوو ئەمڕۆ

بەهارە، سەوزە دەشت و دەر، دڵم بۆیە وەکوو بولبول
لە باخا بۆ گوڵاڵەی سوور و گەش دەگرێ گوڕوو ئەمڕۆ

بە غەیری بولبولی ماتی دڵی دیلم کە تەنیایە
مەلی‌تر پاکی دڵشادن دەخوێنن دوو بە دوو ئەمڕۆ
# # #

# گێژەڵووکەی خەم

بۆ رۆحە بەهارییەکەی ژیلا حوسێنی

هەواری سەوزی شیعری تەڕ هەمیسان رەنگی رووی گۆڕا
بە خوڕ خوێناوی ناکامی لە جەرگی سوورەگوڵ چۆڕا
هەمیسان ماتەمێکی‌تر چەمی کەیلی ئەشک کردم
پەیا بوو پایزی خەم، گوڵوشەی شیعری وشک کردم
هەمیسان گێژەڵووکەی خەم بە لرفە و هاژە پەیدا بوو
لە گوڵزاری ئەدەب هاڵا، بەگژ گوڵباخێتردا چوو

هەمیسان چاوی پێنووسم لە فرمێسکا ئەوِ بۆوە
وشەی ڕەشپۆشی شیعرم کەوتە کۆڕی شین و ڕۆڕۆوە
قەڵەم دیسان لە گۆمی خوێن و ئەسرینی گەشا گەوزی
پەری شیعر و ئەوین ڕەش هەڵگەڕا باڵای گەش و سەوزی
نیگای ڕوون و گەشی ئاسۆ لە نێو تەمدا نوقم بۆوە
دڵی گەرم و گوڕی دەشتی ئەدەب پۆشتەی زوقم بۆوە
وشەی چاوتەڕ هەموو زامار و دڵ پڕ حەسرەت و داخن
قژی خۆیان ڕنیوە هەرچی گوڵجاڕ و ڕەز و باخن
شیعر خنراوە ئەوکی، نزگەرەی مەرگی لە سەر لێوە
ئەوی هەست و حەز و ئیلهامە گرکانی خەمی پێوە
«ئەوین» ئەمشەو دەروونی پڕ لە پشکۆیە و «گەشە»ی نایە
فریشتەی شیعری دڵناسک لە حاڵی گیان کەنشتایە
قەڵەم دەگری بەسەر سنگی شەڵاڵ و سەردی دەفتەردا
دڵ و هەست و خەیاڵ ئاوێتە بوون ئەمشەو لەگەڵ دەردا
«ئەوین» وا بێ «گەشە» و بێنازە سەرتاپێی لە هەش ناوە
شیعر بسکی لە شاباڵی گڕی ماتەم گرێ داوە
لە نێو بەندی بەسامی دێوی مەرگی بێ بەزە و تووشا
بە چڕنووکی ئەجەل کوڵمەی فریشتەی ئەشق و حەز رووشا
بەڵێ «ژیلا» لە گوڵجاڕا وەکوو بارانە بوو ئەشکی
لە چاوی سەوزی ئیلهاما دوڕی یەکدانە بوو ئەشکی
بەڵام دەستی مەرگ هات و دوڕی ئەشکی سڕی ئەمڕۆ
پڕووزا باڵی پەروانەی پشووی گەرم و گوڕی ئەمڕۆ

ئەگەر ون بوو لە چاوان، وا لە نێو رۆح و پشوومانا
لە گەڵ واژەی شیعردا دێ بەسەر لێوی هەموومانا
شیعر دوای ئەو ئیتر چۆن گوڵ ببارێنێ بە سەر ژینا
دەبێ باڵی ببەستێ وەک پەپوولەی ئارەزووی «ژینا»
هەتاکوو دەفتەری ژینم دەسووتێ پەڕ بە پەڕ دەگریم
لە گەڵ یادی هەموو رۆژێ بە چاوی شیعری تەڕ دە گریم

# # #

# هەوڵ

لەنیشتمانی ژینم دا
شادی و حەز رەتێندراون
بوونە ملوێنکی ئەستێرە و
لە ئەستۆی ئاسۆ کراون
بە رۆژ و شەو هەر دوو دەستم وەک برووسکە
هەڵێناوە و
هەرچی دەکەم
دەستم ناگاتێ دایگرم.

# # #

# ئاوات

ناڵێم خۆزگە
هەموو جیهان
ببێتە تاقە یەک وڵات،
دڵی نەرمی دڵدارەکەم
بەرگی سەوزی
شیعرەکانم لە بەر بکات!

ناڵێم خۆزگە
کۆشی شەو پڕ بێ لە گڕی چاوی هەتاو،
هەرچی تفەنگە بخنکێن
بە شەپۆلی خوێنی ڕژاو!

دەڵێم خۆزگە
وەرزی تەمەنی درێژی چاوەڕوانیم
کۆتایی بێ
ژن و کچی وڵاتەکەم
ئیتر پەپوولەی نیگایان
لە دۆزەخی چاوی زێڕدا نەسووتێنن،
ڕۆژی جارێ
تەنیا جارێ
بە باڵی ئەو پەپوولانە
تۆزی ڕوومەتی کتێبێک بتەکێنن!

# # #

# سنوور

که هەژدیهای ڕەشی سنوور خۆی ڕاکێشا و
دڵی گەرمی زەویی ئاشقی کوتکوت کرد
چەم و زەریا
پەنجەی نەرم و پەمەییان لێک هەڵپێکا
شایی پێوەندییان گرت و
دڵی سەوزی خاکیان پێکەوە گرێدا.

که بەرد و سمیت و ئاسن
قورگی زولاڵی ڕووباریان توندتوند گوشی و
بوونە بەستێن،
ئاوی ئاشق
لە سەر دڵی
بەتیشکی زێڕینی هەتاو
نامەیەکی چاو پڕ لە فرمێسکی نووسی و
بە پۆلێ کۆتری سپیی هەڵمدا ناردی بۆ هەور
هەوریش دەستێکی بە چاوی تەڕی نامەکەدا هێناو
لە گەڵ با دا
ڕەوە ئەسپێکی دڵپڕی
بە شمشێری برووسکەوە
نارد بۆ ڕووبار
کاتێ گرمەی ڕەوە ئەسپی
تووڕەی هەور
دڵی تەنگی زەویی لەراند
بەستێن ڕووخا
چۆم و کانی و تاڤگە هەستان

پەنجەکانیان،
لە یەکتر هەڵپێکایەوە و
دڵی زەوی

پڕ بوو لە گەرمایی رۆحی
سەوزی بەهار.
داپێم بڵێن!
دەتوانن سنوور
بۆ خۆر و
هەور و
با ـ و
بەهاریش دانێن؟!

# # #

# بیرەوەری

من لەوەتا وەبیرم دێ
زەوی لە ژێر باڵی شەودا
پشوو دەدا و
ئاسمان کۆشی پڕ لە هەوری سەر بڕاوە

ئەرێ شەوبا ئاوارەکە!
تۆ ئەستێرەیەک ناناسی
هەواڵی مانگ و هەتاوی لێ بپرسم؟!

# # #

# خەون

گوڵ، بەرلەوەی لێو بە لێوی
سروەوە نێ و
ماچ گۆنای سوور هەڵبگێڕێ،
خەونی پەمەیی بە خۆر و بە بەهارەوە
دەبینێ.

من بەرلەوەی لێو بە لێوی
شیعرەوە نێم
ژان و شەوەزەنگ
پێنووس و پەنجەم رەش، رەش
هەڵدەگێڕن،
خەون بە زام و هەنیسک و
ئەشک و خەمەوە دەبینم!
# # #

# ئەوین ١

شەو،
چەندەی هەتاو خۆش دەوێ
هەتاو،
سەد هێندە شەوەزەنگ
چونکە ئەو نەبێ
هیچ کەسێ
لە دەست ئازاری تاریکی
نایەتە دەنگ.

# # #

# ئەوین ٢

قەڵەمەکەم
باڵای کچێکی لە عەتری
سەوزی شیعر هەڵکێشاوە،
کوندەبووی ناز
قەت باڵی بە سەر باڵایدا
نەکێشاوە!

شیعرم بۆ بەرۆک و قژی
کچێک کردۆتە گوڵاڵە
کە ئاوێنەی چاوەکانی
بە پرشنگی ئەوینێکی
پاک و خودایی
زوڵاڵە.

دڵم بۆ مەلی ئەوینی
کچێک کردۆتە
هێلانە
کە کانیاوی سەوزی رۆحی
پڕ لە ئەشق و
خۆشەویستیی نیشتمانە.

# # #

# ئێوە

خەمەکانتان تەم و مژە!
سەر تەوێڵی دوندی شیعرم
جێ ناهێڵێ،
تا ئەو کاتەی هەناسەتان
دەبێتە بای دار ئاوس و
لە سەر لێوی
وشە و
چیا و
درەخت و

گوڵ
زەردەخەنە دەپشکوێنیٚ!

خەمەکانتان کرپۆمیە!
بە سەر سنگی دەشتی دڵما
ورد ئەباریٚ
تا ئەو رۆژەی
بزەکانتان
دەبێتە شمشێری خۆر و
لە کاڵانی ئاسۆی ئەوین
دێتە دەریٚ،
سەری رەشی هەوری خەم و
ناهومێدی دەپەڕێنیٚ!

# # #

# گلەیی ١

هەتاو،
کە بە سەر داوێنی شەوەزەنگا
چەپک، چەپک
فرمێسکە تیشکی زەرد و سوور
دەبارێنێ،
شنە بسکی شانە دەکا و
گوڵ،
عەتر لە سنگ و بەرۆی
دەپرژێنێ!!

کەچی ئەمن
ئەو هەموو فرمێسکە شیعرەم
لە هەوری دڵپڕی چاوانم
داباراند،
نە دڵت بوو بە ئاوێنەی
گیانی ماندووی وشەکانم
نە نیگاشت
دەستی کردە گەردنی ژیلەمۆی چاوم؛
وەنەوشە جاڕی بسکیشت
تۆزێ عەتری سەوزی ئەوینی
نەپرژاند
لە زامی زەردی هەناسەی
سەر بڕاوم!!

# # #

# گلەیی ٢

پایزانە،
قەتار، قەتار گەڵای زەرد و سوور دەبینن
لە گەڵ هەنگاوی باهۆزدا هەڵپەیانە و
لە پاوانی قژیدا دەگیرسێنەوە!
بەڵام جارێک
لە سۆڵاێی فرمێسکەکانم ناڕوانن
کە لە باڵای کوێستانی ئەوین هاڵاوە و
هەر گەردەلوولێ بە لایدا تێدەپەڕێ
بسکی تۆزاویی لە بەردا دەشواتەوە و
هەگبەیەک ئاڵتوونی گەڵای
لە باوەش دا بە جێ دێڵێ!

# # #

# ئەمەگ

گریان،
باخی پەلکەڕەنگینەی خەیاڵم
جێناهێڵێ،
چونکە من لە نێو هەناوی
گریانێکی کپ کراودا
گووراوم و

لە سەر داوێنی
باران و
شیعر و بەیان
لە دایک بووم.

###

# لاوکی بێزاری

بۆ هاوڕێم: مەهدی زریان

تینووم، تینوو
من لە گەرووی ئەنگوستەچاوی شەوەوە
هاتوومەوە
چەمۆڵەی بێزاری مەنێن بەروومەوە!
تینووم، تینوو
من بە پەیژەی ئازارا هاتوومە خوارێ
هاتوومەوە
بارانی خۆشەویستیتان
بە سەر شۆرەکاتی رۆحی بریندارمدا

بباریّ!
هاتوومەوە
تاکوو لە بەر تاڕگەی چاوتان
گیانی ماندووم بشۆمەوە،
لە کانیاوی روونی دلّتان
جامیّ ئەوین بخۆمەوە!
هاتوومەوە
ساتیّ لە ژێر دەواری خەونەکانتاندا
ئۆقرە بگرم،
رۆحم لە رۆحتان گریّ دەم
گویّ لە کسپەی دلّی هەلّقرچاوتان
بگرم!

ئاخۆ دایکم،
دوای فڕینی رەوە کۆتری سپیی ماچ و
تێک هالّانی پەلکەڕەنگینەی نیگامان،
دەلّیّ:
ـ «گەردەلوولیّکی چڕ
بەر گلێنەی چاوەڕوانیمی تەنیوە،
هەر چاوێکم
تەرمی سەدان نیگای خنکاوی بە بالّای
برژۆلّیدا هەلّواسیوە؟!»

باوکم، وەکوو جاران دەڵێ:
ـ «لە سەر سنگی ئاوێنەی ژین
هەموو ڕۆژێ
چەقۆیەکی چاو سوور سەرچۆپی بۆ پۆلێ
زامی کوڵمە ئاڵ دەگرێ؟!»

ئەرێ برا شاعیرەکەم
ئێستەش دەڵێ:
ـ «قەڵەمەکەم
دار گێلاسێکی ڕەشپۆشی قژ سووتاوە
چوار وەرزە بەری فرمێسک و
خوێن دەگرێ؟!»
دایە!
ئێستەش
زایەڵەی دەنگت لە ئەوکی
ڕەوەزی ڕۆح و بیرما دەزرینگێتەوە:
ـ «ڕۆڵە بڕۆ
ئەگەر لە ژێر لیزمەی بارانی ئاگردا،
لە ژێر تین و تەوژمی ڕمب و خەنجێری
تیشکی هەتاوا هەڵقرچای،
مەچۆ ژێر سێبەری باخێ

دار گەڵای خۆی بڕنێتەوە،
گەڵاش دەستی پەڕیوی خۆی
هەڵگرتبێ و
بە حەواوە بخولێتەوە،
چاوەڕوانی با گەڕێک بێ
دوور بیبات و
لە باوەشی سڕی دایکی دوورخاتەوە!»

دەنگی باوکم
ئێستەش لە نێو دەمارەکانی لەشمدا
لە گەڵ خوێنم دەستەملانە:
- «برۆ، برۆ!
بە غەریبی سەر بنێوە،
لە نێو دڵی تەنگی بێکەسیدا بژی
لە ژێر چزووی
چاوی ساردی بێگانەدا
جینگڵ بدە،
بەڵام
هەرگیز روو لە شارێک مەکە
مەیدان، شەقام سەر ببڕێ،
شەقام، کۆڵان بخنکێنێ،
کۆڵان، ماڵ زیندەبەگۆڕ کا و

ماڵ، بەندیخانەی مرۆڤ بێ،
مرۆڤیش، مێشک و دڵی خۆی
لە نێو کاسەسەری خوێدا هەڵگوڵۆفێ!»

هەموو شەوێ
لە ئاوێنەی گریانی دەفتەرەکەمدا
بڵێسەی فرمێسکی برا شاعیرەکەم
دەستی تەزیو و لە گۆ چووی چاوم
گەرم دەکاتەوە:
ـ «قەت روو لە وڵاتێک مەکە
قەڵەم، نووکی خۆی بشکێنێ،
شاعیر، شێعری خۆی سەر ببڕێ،
شێعریش، وشەی بخنکێنێ!
نان، لە گەنم بتۆرێت و
ئاو، لە کانی
هەتاو، لە ئاسمان بێزار بێ و
ئاسمان، لە ئەستێرەکانی!»

# # #

# کێبەرکێ

ئێوارەیە
پشکۆی هەتاو
لە باوەشی کوانووی ساردی ئاسۆدایە.
ڕێبوارێکم ڕێگام هەوراز و هەڵەتە و
هێزی هیوا
بۆتە شاباڵی هەنگاوم.
هەورازی ڕژد و بەردەڵان

سەری کڕنۆش بۆ هەنگاوم دادەنوێنن.
ئەمشەو لە گەڵ هەتاودا کێبەرکێمانە
ئەمن بەم دیوی چیادا هەڵدەگەڕێم،
ئەو بەو دیوا.
هەنگاو دەنێم...
تازە من و گەڕانەوە:
خوێن و زامین
تازە من و گەڕانەوە:
ڕۆح و تەرمین
سەردەکەوم
بەر لە هەتاو
خۆم دەگەیەنمە سەر دوند و دەبمە بەڕوو
لاقم لە سەر سنگی چیا دەچەقێنم،
ڕەگم لە جەرگ و هەناوی
دەهاڵێنم
کە هەتاویش هاتە سەریێ
وەکوو تاجە گوڵینەیەک
لە سەر لووتکەی چیای دەکەم!
ئەمسا نووکی
ڕەشی پێنووسی خەیاڵم
لە چاوی خۆر وەردەدەم و
بە سەر دێڕی

سەوزی پەڕەی
ڕۆحی تینوومیدا دێنم،
ئیتر بە جێی شیعری ڕەشپۆش
شیعری گەش و
تارا زێڕین دەخولقێنم.

# # #

# پایز

بووکی شۆخ و شەنگی پایز
بەرگی زێڕینی پۆشیوە و
بۆ باوەشی ساردی زاوای زستان دەچێ.
هاژەی زریان:
ئاهەنگی ئەم پێوەندە تاڵەی سروشتە.
دارەکانیش:
وەکوو دایکێکی دڵ خەمین
بە رەنگی زەرد و ناخی پڕ لە دەرد و داخ
زێڕوەشانی ئەم بووکە بێ نازە دەکەن.
###

# شەو

شەوە، شەوێکی مات و سڕ
قژی رەشی هاڵاندووە
لە بەژنی شاخ و داخی چڕ
ئەوا ترۆپکی دەم ئاسۆ
بە ژانی مانگەشەوەوە

جینگڵ ئەدا و
لە سەر تەوێڵی لێڵی شەو
بە ریزە نێرگس دەڕوێن
هەموو بە زەردەخەندەوە سەما دەکەن
تا لە هەناوی کەلەوە
هەیێ سەری وەدەر دەنێ

شەوە شەوێکی گرژ و مۆن
خەیاڵ و هەستی هەڵوەدام
کۆچەری شوێن خەیاڵی تۆن!
ئەوا قەڵەم بە یادی تۆ
بە ژانی هۆنراوەیەکۆ
جینگڵ ئەدا و
لە سەر دڵی سپیی پەڕاو
چەپک، چەپک وشەی ئەوین
وەک گوڵەباخ دەپشکوێن
هەموو بە چاوی سوورەوە
شیوەن ئەکەن
تا لە دڵی خەیاڵەوە
کانیی شیعر هەڵدەقوڵێ!

###

# تەنیایی

کە شەو جیوەی روخساری خۆی
لە شووشەی پەنجەرەی ژوورم هەڵدەساوێ،
پڕ دەبێ سنگی پەنجەرەم
لە بۆنی سەوزی ئاوێنە و
تەنیاییم لە نێو دڵیدا بزر دەبێ.

لەم شەوەوە
پەنجەرەکەم دەکەمەوە،
با گەڵای وێڵی تەنیایی
لە گەڵ سروەی هەناسەی شەو بێتە ژووری و
بۆنی شیعرم بۆ بهێنێ.
# # #

# بەڵگە

مەرگ و ژیان
دوو دڵدارن
تا پێوەندی ئەوان نەبێ
هەرگیز
هەرگیز
ئەوین و خۆشەویستی
لە دایک نابن.

# # #

# بانگەواز

بۆ غەزەلێکی بزر بوم

ئەریَ هاورِیَ!
تۆ کۆتری هەنیسکە سەر براوەکانمت نەدیوە؟
بە گوێسوانەی سووتاوی غەزەلێکەوە
نیشتبنەوە،
بە سۆزێکی خەمین و غەریبانەوە
بگمێنن؟!
ئەی پەپوولەی هەناسە باڵ سووتاوەکانمت نەدیوە،
بە سەر حەوت دڵۆپە فرمێسکی وەریو دا
بخولێنەوە،
باپووسکەی زێرِینی باڵیان
بە سەر ئاوێنەی بیَ غەوری گۆنایاندا
بپرژێنن؟!
# # #

# نیو نیگا

ئەی شاکچی نازەنینی
شاری حەز و خەونەکانم!
کە پەنجەی گەرمی نیو نیگات
پەردەی پڕتووکاوی لە سەر
گلێنەی پەنجەرەی دڵم هەڵدایەوە،
بە تیشکی زەردەخەنەیەک
زوقم و شەختەی خەمەکانم
توایەوە!

# # #

# هاوار

که دادەخورپێ
دڵی ئەویندار
مۆچڕک و تەزوو
جۆگەی دەماری
دەکەن بەرووبار.

کە لێوی ئاسۆ
بزەی تێدەزێ،
زەوی پڕ دەبێ لە بۆنی رۆژ و
پەپوولەی گزنگ

کەزامی قووڵی شاعیر چڵ دەدا
لە گیرفانی خۆر
پێنووس دەردێنن
پێنج چەپکە پڕشنگ

جەستەی پێنووسیش
کە جینگڵ دەدا
پۆل، پۆل هەڵدەفڕن
وشەی بریندار،
دەچنە ئاسمانی گەرووی شیعرەوە و
دەبن بە هاوار.

# # #

# خـەم

له ژێر قژی تەڕی بارانەشەوێکا
سەرم نا بە دڵی پڕی هەورێکەوە،
بزەی هاتێ!
برووسکەیەک،
لە کەلێنی لێویەوە شۆڕابەی بەست و
کەوتە سەر ئاوێنەی نیگام
پەنجەم هاڵاند لە پەنجەی زەردی برووسکە و

وەسەرکەوتم
چوومە نێو دڵی هەور و
ئاسمانەوە،
رۆحی سەوزی شیعرێکی چاو فرمێسکاوی
باڵای لە رۆحم هاڵاند و
هەناسەی گەرمی ئاوێتەی هەناسەم کرد

لەو شەوەوە
ئەم خەمە رەشپۆشەی ناخم
هەتا دێ هەر باڵا دەکا
بۆیە لە نێو دڵی هیچ فرمێسکێکا
جێی نابێتەوە!

# # #

# شەونم

تۆ کە دەرکەوتی مەپرسە چیی بە سەردێ گیان و دڵ
حاڵـەتـی شـەونـم تەماشاکە بە وەختـی ڕۆژهـەڵات
«مەحوی»

لە گەڵ ئازار و جینگڵ و گەرمەژانی
شەوەزەنگ هاتە دنیاوە،
لە ترووکەی پێلووی سرپی چرکەیەکدا
فڕی بە سەر گڕەشقانی برژۆڵی ئەستێرەدا.
لە پووکانەوەی ڕوومەتی تریفەدا،
لە کەوانی ڕاخوشینی نێزەکێکدا نەگیرساوە.
فڕی... فڕی
لە نێو دارستانی قژی کازیوەدا
نیشتەوە بە سەر تەوێڵی لاپەڕەی سەوزی گەڵاوە،

لە سووچی پەردەی ئاسۆوە
کە خۆر چاوێکی لێ قرتاند
زوو راچەنی و
خۆی گرێدا بە شاباڵی نەرمی با ـ وە.

# # #

# خـەو

کە تەنیایی
دامدەپۆشێ
ئیلهامی سەوزی غەزەلێک
وەکوو خەو دڵم دادەگرێ و
لە سەر سینەی نەرمی یادت
خەوی شیرین دەمباتەوە،
بۆیە کاتێ رادەچەنم
زایەڵەی زوڵاڵی شیعر
لە شمشاڵی گەرووما دەنگ دەداتەوە.

# # #

# سەفەر

بۆ یادی سەوزی مارف ئاغایی

**تۆف و بەندە**
**بۆ کوێ دەڕۆی؟!**
**لە سەر ڕێتا هەر شەختەیە و**
**لە سەر پشکۆی ئەسرین خۆی**
**هەڵدەقرچێنێ**
**دوو پشکی ڕێ**
**چزووی تەزوو لە پشتی خۆی**
**دەچەقێنێ!**

خمخۆرکی بزۆزی زەمان،
ساتە کوڵمە نارنجی و لێو بە بزەکان
هەڵدەلووشێ
«سروە» قژی سەوز و تەڕی خۆی دەرنێ!
رەوە، رەوە ئاسکی وشە
چەواشە بوون
پۆل، پۆل کۆتری سرکی شیعر
باڵیان لە خوێنی خۆیانا
دەشۆنەوە!

تۆف و بەندە
بۆ کوێ دەڕۆی؟!
برژۆڵی ـ با ـ کەڕەسیسەی
لێ نیشتووە!
چاوی هەتاو سۆمایی تێدا نەماوە!
لە شەوەزەنگی بە سامی
ماڵئاوایی و کۆچ و ژانا

ـ لە دووری پرشنگی نیگات ـ
گەڵای شیعر،
هەموو سەریان لێ شێواوە!
بگەڕێوە!

پەنجەت بۆ کەزیەی «شۆڕەبی»
بکە شانە و
«بە چاوی گەڵا»ی سەرگەردانی شیعر!
بگەڕێوە!
«کوڵی گریانە خەستەکەت هەڵبڕێژە
گشت دڵپڕین،
رۆحمان پڕکە لە زایەڵەی ئاوازی شین
گشت بیسەرین،
تابلۆی زیندووی شیعرەکانت
بە گڵێنە و دڵەکانمانا هەڵواسە
گشت خوێنەرین!»

# # #

# هەواڵ

بۆ یادی ئازیزی مامۆستا حەقیقی

دەمەو بەیان
بەر لەوەی دایکی خۆرەتاو
زەوینی شەختە لێ دراو
لە باوەشی بەتینیدا بلاوێنێ،
بەر لەوەی چاوانی کزی ئەستێرە خەو زڕاوەکان
لە نێو بێشکەی ڕووناکی تیشکا بنوێنێ،
ڕەشماری هەواڵێکی تاڵ
هالا لە داری هەستم و
دەمی نایە نێو هێلانەی مێشکمەوە!
ژاری ئازار
بە نێو جۆگەی دەمارمدا وەڕێ کەوتن

پێنووسە خەمبارەکەشم
کەوتە ئەستێرکی بێبنی ئەشکمەوە!

دوای کۆچی تۆ لەم شارەدا
بە سەر لقی لێویێکەوە گوڵی بزە ناشنێتەوە!
لە باخی هیچ چاوێکەوە
پەپوولەی گەشی نیگایەک نافڕێت و
باڵ لە باڵی پەپوولەی نیگایەکیتر
هەڵناساوێ!
لە دارستانی کڕی دڵەکانماندا
هەرگەڵایە و بە سەر جۆڵانەی تەزیو و
سڕی لقەوە وەنەوزی زەرد دەدات و
مۆتە خەونی شەختە هەڵی دەچۆقێنێ!
هەرشاباڵی باڵندەیە و
گێژەڵووکە لە کۆشی تۆزاوییدا
دەیپێچێتەوە.
هەر زەرنەقووتەی وشەیە و
سوججە ماری برسی زەمان بە زیندوویی
قووتیان دەدا.
لە گۆڕەپانی خەیاڵ و ئەشق و دڵدا
هەر شیعرە و لە بەر شە بەقی چاوی زێڕ
شەوارە بووە

هەرپەنجەیە  و
لە گەردنی قەڵەمدا ویشک هەڵاتووە.
خۆری ئەوین:
بە ژەنگی زنجیر و قوفڵ
پەنجەرەی دڵی خنکاوە.
بووکی خەیاڵ:
بە برووسکەی چاوانی خۆی
ئاگری لە خۆی بەرداوە.
دوای تۆ شادی
ـ بە میوانیش ـ

رووی لەم شارە نەکردووە!
هیوا،
لە خمخۆرکی رەشی ناهومێدیدا
مردووە!
لە گوڵجاڕی بیر و خەیاڵی منیشدا
ـ دوای کۆچی تۆ! ـ
شیعری شادی
مەلێکی پەرەوازەیە و
روو لە سەر چڵی زمانم
ناکاتەوە،
نامۆیی لە گەرووم دەکا و

تاوێ لە سەر لق و پۆپی
لێرەواری تینووی تاسەم
ئۆقرە ناگرێ!

چونکە شیعرم
ئەویینداری نیگای تۆیە،
فریشتەیەکی رەشپۆشەو
دوای کۆچی تۆ!
دەس لە ملی هەناسەی کەسی تر
ناکا!

گەرچی لە چاوانم ونی!
بەڵام یادت
پەرەسێلکەی هەناسەیە و
دڵمی کردۆتە هێلانە،
گەرووی سەوزی
مەلی شیعریشم لە دووریت
کەیلی ناڵین و گریانە!

# # #

# قەتار

بۆ هەناسە بە سۆزەکانی
محەممەد مامڵێ

هەنیسکێکی دیکەشیدا
- زەمان -
جەرگی بە کوچکەوەنرا
- قەتار -
موچڕکێک بە دڵیدا هات
- وەرز -
لە نێو دووکەڵ و بۆ کوڕووزی
بسکی ئاڵۆزی وشەدا شەوارە بوو
- شیعر -

که بارگەی هەناسەکانت!
بەرەو هەواری بێدەنگی ماڵئاوایی
پێچایەوە،
گوێت لە قیژەی سەربڕاوی شیعر نەبوو
ئەوکی نۆتی دەلەرزاند و
باڵای رەشپۆشی گۆرانی
لە نێو چرە تۆزی شین و سەردوولکەدا
چەمایەوە؟!
ئەوکاتەی نەرگزی سیسی دوایین سەرنجت
بە جێ هێشت،
ێیە تەوێڵی شۆڕەبی‌یەکەی چوارچراوە
ئاخۆ باڵی چەن قەتاری پەپوولەییت
هەڵوەرین و
رژانە نێو قورگی سڕی رەشەباوە؟!

ئەو چریکە ئاگرینەی
لە نێو گوێچکەی شەوەزەنگا
چەقەرەی دا و
لە گەڵ سریوەی ئەستێرە دەستەمڵان بوو،
بە شوێن خەونی هەڵوەریوی مانگەشەودا

دەخولێتەوە،
یان لایەلایە بۆ رۆحی بێ ئارامی «هێمن» دەکا؟

لە ژێر میچی ئەم شەوە قورماوی‌یەدا
ئەوە شانەی برووسکەیە
قژی هەور دادەهێنێ،
یاخۆ زایەڵەی قەتارە
شنەی باڵی بە دەماری ئاسمانی زاماردا دێنێ؟

٩
کە دڵتەنگی چەپکە پڕشنگی خەیاڵم بۆژۆ دەکا و
پشووی گەرمی بەرخی بزەم لێ دەتۆرێ،
رۆحم بە تاڵی برووسکەی چریکەتەوە دەبەستم
بە ئاسۆگی ساماڵی تەزووی شیرینا تێدەپەڕم
دەم دەنێمە کانیاوی زولاڵی خۆر و
جۆگەی سەوزی گەشانەوە و ئۆقرە گرتن
بەرەو ناخم هەڵدەبەستم.

من چیرۆکی ئاشق بوون و
پشکووتنی چریکەتم لە سەر لاپەڕەی روومەتی
گۆرانی‌یەک خوێندۆتەوە:
«شەوێک شیرین

لە کۆڕی ڕەشبەڵەکی ئەستێرەکاندا
دوو دەسرۆکە سەمای دەکرد
سەما، سەما
بێدەنگ، بێدەنگ
شیرین، سەما
ئاسمان و ئەستێرە، سەما
سەما، سەما
بێدەنگ، بێدەنگ
ماندوو، ماندوو
شەونم لە کوڵمەیان تکا.
ڕێژنە شەونم
گۆڕە بزر بووەکەی وەفایی خووساند.
دڵۆپەیەک لە ڕوومەتیدا و ڕاچەنی
کاتێ سەری ماندووی غەریبیی هەڵبڕی،
چاوی کەوت بە ڕەشبەڵەکی ئەستێران
شیرینی دی لە سەر چۆپی
خەریکی دەسرە بادانە
ماندوو، ماندوو هەڵدەپەڕێ و
شەونمی سەر کوڵمەکانی بوونە خوناوکەی بارانە.
سەوزە شیعرێکی هەناسەی
هەڵفڕاند و
لە سەر بسکی تەڕی شیرین گیرسایەوە،

چرپەیەکی بە گوێیدا کرد
پەڕی کوڵمەی
وەک مێلاقە گەشایەوە.»
شیرین بە کەزیەی برووسکەی هەڵیکێشای!
لە پیاڵەی زێوینی مانگدا
شەونمی روومەتی خۆی و
شەڕابی هێشووی ئەستێرەی دایە دەستت!
لەو کاتەوە
بوویە سریوەی ئەستێرە و
تیشکی خۆر و تریفەی مانگ !
بوویە گزنگی بەیان و
چاوی زەریا و رۆحی باران!
بوویە هەناسەی گوڵاڵە و
وردە شەپۆلی کانیاو و
شنەی شابسکی دارستان!
بوویە جریوەی باخان و
هاژەی چۆم و قاسپەی کوێستان !
بوویە تەزووی شیرینی دەماری زەوی،
لە بەر ئاوێنەی هەتاوی شیعرا،
گرتت
باڵات بە باڵای کوردستان!
# # #

# وێنە

بۆ یادی جەعفەری قازی و مارف ئاغایی

لە سەر گلێنەی تەماوی تابلۆیەکا
وێنەی هەتاو و نانێکم پێکەوە دی
باوەشیان دەکرد بە یەکدا و
لێویان دەبوو بە کانیاوی پڕشنگ و ژین.

بە سەر روخساری ئالۆزی شیعرێکەوە
فرمێسکێک و بزەیەکم پێکەوە دی
دەمیان لە دەمی یەک دەنا و
چاویان دەبوو بە رووباری خەم و ئەوین

بە دەم ئاسۆی خەم لێ نیشتووی گریانەوە
دوو پەپوولەی ئەویندار

بۆنی سەوزی رەنگ و بڵێسەی شیعرم دی
باڵیان لە باڵی یەک دەدا و
دڵیان دەبوو بە بارانی داخ و ئەسرین.

لەو رۆژەوە
لە نێو رۆحی بێ ئارامی ساتەکانا
بە سەر تەوێڵی پەمەیی بەیانەوە
پەڕەمووچەیەکی سەوز و
پێنووسێکی سوور دەبینم
سنگی رەشی رێگا دەبڕن
هەر دەڕۆن و هەر دەڕۆن و
گوڵ و
هەتاو و
ئاوێنە و
شیعر لە جێ پێیان دەڕوێ.
###

